# پوختەی بنەماکانی ئیمان و ئیسلام

## لێکۆڵینەوەی یەکەم (ئیمان)

< كوردي - كردي- kurdish >

دكتۆر عبد الله محمد أحمد الطيار

وەرگێرانی: ئومێد عمر علی

پێداچونەوەی: پشتیوان سابیر عەزیز

# پوختەی بنەماکانی ئیمان و ئیسلام

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی :

سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە داوای یارمەتی و کۆمەك ولێخۆش بوونی لیَ دەکەین، وە پەنای پیَ دەگرین لەخراپەی دەروون و کاروکردەوەمان، هەرکەسێك خودای گەورە هیدایەت ورێنموونی بکات بۆ سەر ئاینی پیرۆزی ئیسلام، کەس ناتوانێت گومڕای بکات، وە هەرکەسێکیش ئەو گومڕای بکات (بەهۆی کاروکردەوەی خراپی خۆیەوە) کەس ناتوانێت هیدایەتی بدات و ڕێنمونی بکات، شاهیدی دەدەم کە هیچ پەرستراوێکی بەهەق نییە جگە لە خوای گەورە و پەروەردگار (الله) کە هیچ شەریك وهاوەڵێکی نییە، وە شاهیدیش دەدەم موحەمەد بەندە و پێغەمبەری خودایە ﷺ .

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢ ﴾[1]

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ١ ﴾[2]

---

([1]) آل عمران: 102.
([2]) النساء: 1.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ٧١﴾[3] .

له پاشان، خوای گەورە عیبادەت وپەرستشەکانی بۆ خۆی بڕیار داوە، هەر ئەمەیش مەبەستی سەرەکی بەدیهێنانی بەندەکانیەتی، وەك فەرموویەتی : ﴿وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ ٥٦﴾[4] واتا : من جنۆکە و مرۆڤەکانم دروست نەکردووە، تەنها بۆ پەرستنی خۆم نەبێت، هەر ئەمەش بانگەواز و هاواری سەرجەم پێغەمبەران بووە بۆ گەلەکانیان، وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ﴾[5] واتا : خوای گەورە بپەرستن ودوور بکەونەوە لەهەموو شتێك کە جگە لەخوا دەپەرسترێت، هەروەها فەرموویەتی : ﴿ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓۚ أَفَلَا تَتَّقُونَ ٦٥﴾ [6] واتا : تەنها خوای گەورە بپەرستن، جگە لە ئەو هیچ پەرستراوێکی ترتان بۆ نییە، دەسا ئیتر بۆ لە سزا ناترسن و خۆ ناپارێزن ؟

شێخ الاسلام ابن تیمیة (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لەم بارەیەوە ووتویەتی: « إنما الدين الحق هو تحقيق العبودية لله بكل وجه وهو تحقيق محبة الله بكل درجة وبقدر تكميل العبودية تكمل

---

(3) الأحزاب: 70-71.
(4) الذاريات: 56.
(5) النحل: 36.
(6) الأعراف: 65.

محبة العبد لربه فتكمل محبة الرب لعبده ... وكل محبة لا تكون لله فهي باطلة ، وكل عمل لا يراد به وجه الله فهو باطل »([7]).

واتا: ئاینی هەق وڕاستی ئەوەیە کە بەندایەتی تەواو بۆ خوای گەورە وپەروەردگار بە هەموو شێوەیەك جێبەجێ بکرێت، ئەویش بریتیە لە جێبەجێکردنی ئەو پەڕی خۆشەویستی بۆ ذاتی (الله)، بە ئەندازەی تەواوکردنی بەندایەتی کردن بۆ خوا، خۆشەویستی بەندەیش بۆ پەروەردگاری تەواو دەبێت، هەروەها خۆشەویستی پەروەردگاریش بۆ بەندەکەی ... هەر خۆشەویستیەك بۆ خوای گەورە نەبێت، ئەوە خۆشەویستیەکی بەتاڵ و ناتەواوە، هەر کردەوەیەکیش مەبەست پێی ڕەزامەندی خوای گەورە نەبێت، بێگومان پڕوپووچ و بەتاڵە.

بەداخەوە تا ئێستاش کەسانێك هەن بە هەڵە لەچەمکی بنەماکانی ئیسلام گەیشتوون، بۆیە دەبینین زۆربەی هەڵە لەگرنگترین پەرستنەکاندا دەکرێت، وەك هەڵەکانی ناو نوێژ، و زەکات، و ڕۆژوو، و حەج، لەبەر ئەوە پێویستە ئوممەتی ئیسلام بگەڕێتەوە بۆ هەردوو سەرچاوە سازگارەکەی ئیسلام (قورئان وسوننەت) وشارەزابوون لەژیانی زانایانی پێشین کە سەرمەشقی خێری ئەم ئوممەتە بوون، تا بزانرێت ئەوان چۆن عیبادەتەکانیان ئەنجامداوە ئێمەیش بەو شێوەیە بین، چونکە بەراستی ڕزگار بوون و سەرفراز بوون وسەربەرزی تەنها لە پەرستنی هەقی خوای گەورەدایە، ئەویش لەو ڕوانگەیەوە کە خۆی دیاری کردووە بۆمان و بۆی کردووین بەشەرع، هەر جۆرە پەرستن

---

([7]) العبودیة: (لاپەڕە : 41).

وعیبادەتێکیش لەو چوار چێوەی مەنهەجی پێغەمبەری خوادا نەبێت ﷺ بەتاڵە و وەرناگیرێت و دەدرێتەوە بەسەر خاوەنەکەیدا، وەك خۆشەویستمان محمد المصطفى ﷺ فەرموویەتی: {مَنْ عَمِلَ عَمَلاً لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ } ([8]) واتا : هەرکەسێك هەرکارێك بکات، فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێت ئەوە لێی وەرناگیرێت و دەدرێتەوە بەسەری خۆیدا .

بەڵام بەداخەوە زۆریك نایەن بەدەم ئەم داوایەی پێغەمبەری خوداوە ﷺ، بگرە مانا و مەبەستەکەشیان شێواندووە، بۆیە پێویستە ئەم چەمکە ڕاست بکرێتەوە، و بنەماکانی ئیسلام بەو پەڕی ئاسانی و سادەیی ڕۆشن بکرێنەوە بۆ خەڵکی، بەتایبەت بۆ خەڵکی نەخوێندەوار و ڕەوەند و جالیاتە ئیسلامیەکان، کە زۆر پێویستیان بەو زانیاریانە هەیە لەو بارەیەوە، بەشێوەیەکی سادە وئاسانی وا ڕوون بکرێتەوە بۆیان کە لێی تێبگەن بەڵام پاڵپشت بە بەڵگە لە قورئان و سوننەت .

بێگومان زانکۆی ئیمام موحەمەدی کوڕی سعودی ئیسلامییش لەم بوارەدا پێشەنگی خێر بووە و دریغی نەکردووە، بەوەی هەستا بە دەرکردن وچاپکردنی زنجیرەیەك پەیام دەربارەی پێناسەی ئیسلام وئیمان .

ڕاگرایەتی لێکوڵینەوەی زانستی لە زانکۆی ئیمام کە زۆر سوپاسیان دەکەم، داوایان لێکردم کە کتێبێك بنووسم لەسەر پوختەی بنەماکانی ئیمان وئیسلام، بە شێوازێکی سادە وئاسان تاوەکو ئەو

---

([8]) رواه مسلم في كتاب الأقضية، باب نقض الأحكام الباطلة ورد محدثات الأمور برقم (4493) .

کەسانەی پێویستیان پێیەتی و شارەزا نیین لەو بوارەدا لێی تێبگەن وسوودی هەبێت بۆیان، بۆیە ئەم کتێبەی بەردەستان بەدەمەوە چوونی ئەو داوایە بوو، داواکارم خەڵکانێکی زۆر سوودی لێ ببینن، وە لەخوای گەورەش ﷻ دەپاڕێمەوە کە ئەوەی فێری کردووم سوودی ببێت بۆم، وە ئەوەشی لێی بێ ئاگام فێرم بکات، وە پاداشتی خێری ئەو کەسانەش بداتەوە کە یارمەتیدەر وهاندەرم بوون بۆ نووسینی ئەم کتێبە، خوای گەورەش پشت وپەنای هەمووان بێت، هەر ئەویش بەدەسەڵاتە بەسەر هەموو شتێکدا .

صەڵات وسەلام لەسەر پێغەمبەری خۆشەویستمان محمد المصطفى و ئال وبەیت و یار و یاوەران وشوێنکەوتوانی هەتا هەتایە.

# لێکۆڵینەوەی یەکەم (ئیمان)

ئەم باسانە لەخۆ دەگرێت :

1)بنەماکانی ئیمان .

2)پایەکانی ئیمان .

3)باوەڕ بەخوای گەورە ( الله ) .

4)ئەوەی باوەڕ بەخوای گەورە دەیخوازێت .

5)باوەڕ بە بوونی خوای گەورە ﷻ .

6)باوەڕ بە یەکخواپەرستی ( الله ) لەپەرستندا .

7)باوەڕ بە ناو وصیفەتە پیرۆزەکانی .

8)بەرهەم و شوێنەواری باوەڕ بەخوای گەورەﷻ .

9)باوەڕ بە فریشتەکان .

10)فریشتەکان کێن .

11)چۆن باوەڕ بە فریشتەکان دەهێنیت ؟

12) بەرهەم و شوێنەواری باوەڕ بە فریشتەکان .

13)باوەڕ بە کتێب وپەڕاوە ئاسمانیەکان .

14)مانای باوەڕ بە کتێب وپەڕاوە ئاسمانیەکان .

15) ئەوەی باوەڕ بە کتێب وپەڕاوە ئاسمانیەکان دەیخوازێت .

16) بەرهەم و شوێنەواری باوەڕ بە کتێب وپەڕاوە ئاسمانیەکان .

17)باوەڕ بە پێغەمبەران ونێرراوەکانی خوای گەورە .

18)پێناسەی پێغەمبەران .

19) ئەوەی باوەڕ بە پێغەمبەران دەیخوازێت .

20) بەرهەم و شوێنەواری باوەڕ بە پێغەمبەران .

21)باوەڕ بە ڕۆژی دوایی .

22)مەبەست لە ڕۆژی دوایی .

23) ئەوەی باوەڕ بە ڕۆژی دوایی دەیخوازێت .

24) بەرهەم و شوێنەواری باوەڕ بە ڕۆژی دوایی .

25)باوەڕ بەقەدەر .

26)مانای باوەڕ بە قەدەر .

27) ئەوەی باوەڕ بە قەدەر دەیخوازێت .

28) بەرهەم و شوێنەواری باوەڕ بە قەدەر .

29)گرنگیدان بە بیروباوەڕ بۆچی ؟

30)ئامانجەکانی بیروباوەڕی ئیسلامی .

31)(الولاء والبراء ) پشتیوانی کردن وپشت لێهەڵکردن .

32)گرنگی (الولاء والبراء ) لەبیروباوەڕی موسڵماندا .

33)شێوەکانی پشتگیری کردنی بێباوەڕان .

## ئیمان (باوەڕ)

## پێناسەی ئیمان (باوەڕ)

**مانای ئیمان (باوەڕ) لەزمانەوانییدا** : بە واتای بەڕاستزانین دێت .

**لەزاراوەی شەرعیشدا بریتیە لە** : باوەڕ بوون بەدڵ، ووتنی بەزومان، وکارپێکردنی بە ئەندامەکانی جەستە و لاشە، خـوای گەورە فەرمووپەتی :﴿ قَالَتِ ٱلۡأَعۡرَابُ ءَامَنَّاۖ قُل لَّمۡ تُؤۡمِنُواْ وَلَٰكِن قُولُوٓاْ أَسۡلَمۡنَا وَلَمَّا يَدۡخُلِ ٱلۡإِيمَٰنُ فِي قُلُوبِكُمۡۖ ﴾ [9] واتا : هەندێک لەبیابان نشینە عەرەبەکان ووتیان : باوەڕمان هێناو و موسڵمانین، پێیان بڵێ: نەخێر، باوەڕتان نەهێناوە، بەڵام بڵێن: بەناچاری موسوڵمان بووین، هێشتا باوەڕ نەچۆتە ناو دڵەکانتانەوە و تیایدا جێگیر نەبووە.

پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی:{ الإيمان أن تؤمن بالله وملائكته وكتبه ورسله واليوم الآخر وتؤمن بالقدر خيره وشره }[10] واتا: ئیمان ئەوەیە باوەڕت بەخوای گەورە (الله) و فریشتەکان وپەڕاوە ئاسمانیەکان وپێغەمبەران ورۆژی دوایی هەبێت، وە باوەڕت بە قەدەری خێر وشەڕ هەبێت .

[9] سورة الحجرات الآية : 14 .

[10] رواه مسلم في كتاب الإيمان، باب معـرفة الإيمان والإسلام والقدر وعلامة الساعة (8).

حەسەنی بەصری (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەڵێت: «ليس الإيمان بالتمني ولا بالتحلي، ولكن شيء وقر في القلب، وصدقه العمل» واتا: ئیمان وباوەڕ بەخۆزگە وخۆڕازاندنەوە نییە، بەڵكو ئیمان وباوەڕ ئەو شتەیە كە لەدڵتدا ئۆقرە وئارام بگرێت وكاروكردەوەش ڕاستی ئەوە دەربخات.

جا ئەگەر هاتوو باس وخواسی ئیمان وئیسلام بەیەكەوە كۆبوونەوە، ئەوە بزانە مەبەست لە ئیسلام ئەو كاروكردەوانەیە كە دیارە وبەبەرچاوەیە، وە مەبەستیش لە ئیمان كاروكردەوەكانی دڵە، خۆ ئەگەر ئیمان وئیسلام بەیەكەوە لەباس وخواسێكدا كۆ نەبوونەوە، بەوەی باسی ئیسلام بەتەنها بەبێ باسی ئیمان هات، ئەوە لەو حاڵەتەدا مەبەست لەئیسلام هەموو دین دەگرێتەوە، هەروەك چۆن ئەگەر بەتەنها باسی ئیمان هات بەبێ ئیسلام، ئەوە بەهەمان شێوە مەبەست لە ئیمان لەو كاتەدا هەموو دینی ئیسلامە، بەكورتی ئەگەر بەیەكەوە باسی هەردووكیان هات، ئەوە هەر یەكەیان مەبەستێكی خۆی هەیە، وە ئەگەر بەتەنهایش باسكران، ئەوە مەبەست لەئیمان ئیسلامە و لە ئیسلامیش ئیمانە، خوای گەورەش زاناترە.

**بنەماكانی باوەڕ (ئیمان):** بنەماكانی باوەڕ (ئیمان) كە واجبە لەسەر هەموو تاكێك باوەڕیان پێی هەبێت شەش بنەمایە، هەروەك چۆن خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا باسی كردوون، هەروەها پێغەمبەری خوداش ﷺ لەفەرموودەكانی خۆیدا ڕوونی كردونەتەوە، خـوای گەورە فەرمووییـەتی:

﴿ ۞ لَّيۡسَ ٱلۡبِرَّ أَن تُوَلُّواْ وُجُوهَكُمۡ قِبَلَ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلۡبِرَّ مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ

﴿وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ﴾[11] واتا : چاکەو چاکەکاریی هەر ئەوە نیە ئێوە - جولەکەو گاور- کاتی نوێژ- روو لە خۆرهەڵات بکەن، یان خۆرئاوا، ئەگەر لەڕووی گوێڕایەڵیەوە نەبێت بۆ فەرمانی خوا، بەڵکو چاکەی راست و دروست ئەمەیە کە باوەڕی راستەقینەی بەخواو بەرۆژی دوایی، و بەفریشتەو بەکتێبی ئاسمانی و بەپێغەمبەرانی خوا هەبێت .

**لەم ئایەتە پیرۆزەدا خوای گەورە باسی پێنج لە بنەماکانی ئیمانی کردووە،** ئەوانیش :

**یەکەم** : باوەڕ بەخوای گەورە ( الله ) .

**دووەم** : باوەڕ بە ڕۆژی دوایی .

**سێهەم** : باوەڕ بە فریشتەکان .

**چوارەم** : باوەڕ بە پەڕاوە ئاسمانییەکان .

**پێنجەم** : باوەڕ بە پێغەمبەران .

ماوەتەوە سەر باوەڕ بە قەدەر، خوای گەورە باسی باوەر بەقەدەریشی لەم ئایەتە پیرۆزەدا کردووە، کە دەفەرمووێت :﴿إِنَّا كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقۡنَٰهُ بِقَدَرٖ ٤٩﴾ ([12]) واتا : بێگومان ئێمە هەموو شتێکمان بە قەدەر و ئەندازە دروست کردووە.

---

([11]) سورة البقرة : الآية 177.
([12]) سورة القمر: الآية 49.

دەقەکانی سوننەتیش لەم بارەیەوە زۆرن، ئێمە لێرەدا تەنها ئاماژە بە یەکێکیان دەکەین، کە بە بەڵگەی سەرەکی دادەنرێت لەباسی بنەماکانی ئیمان و ئیسلام و ئیحساندا، ئەویش فەرموودەکەی جوبرەئیلە کە لەناوئاخنی فەرموودەکەدا هاتووە: حدثني عن الإيمان؟ قال ﷺ: { الإيمان أن تؤمن بالله وملائكته وكتبه ورسله واليوم الآخر والقدر خيره وشره } ([13]) واتا : جوبرەئیل ووتی بە پێغەمبەری خودا ﷺ لەبارەی ئیمانەوە بۆم بدوێ ؟ پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی : باوەڕ (ئیمان) بریتیە لەوەی باوەڕت هەبێت بەخوای گەورە ( الله ) وبەفریشتەکانی و بە پەڕاوە ئاسمانیەکان و بە پێغەمبەران و بە ڕۆژی دوایی و بەقەدەری خێر وشەڕ .

**یەکەم : مانای باوەڕ بەخوای گەورە ( الله ) :** دان نان وئیعتراف کردنێکی پێویستی وایە کە هەموو هەواڵ و گوێڕایەڵی وئەحکامەکانی ئەو ذاتە قبوڵ بکات، بەوەی ئەم گەردوونە خالیق و دروستکەرێکی هەیە، کە تەنها ئەو پەروەردگار و هەڵسوڕێنەر وبەرێوەبەرێتی، وە تەنها ئەویش شایانی پەرستن وعیبـــادەت بۆ کردنە، کە هاوشێوە و هاوشانی نییە لەصیفات و ناوە پیرۆزەکانیدا .

بەم شێوەیەش کە باسمانکرد، ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە باوەڕ بەخوای گەورە ( الله ) چەند شتێك لەخۆ دەگرێت :

**یەکەم : باوەڕ بە بوونی خوای گەورە ﷻ**

---

([13]) پێشتر لە لاپەڕە (7) تەخریج کراوە .

چەند شتێك بەڵگەن لەسەر بوونی خوای گەورە ﷻ کە بریتین لە:

1) عەقڵ وژیری مرۆڤ .

2) هەست ودەرکی مرۆڤ .

3) فیترەت و ناخی مرۆڤ .

4) شەرعی پیرۆزی ئیسلام .

**1) بەڵگەی عەقڵ و ژیری مرۆڤ لەسەر بوونی خوای گەورە** ﷻ :

ئەم گەردوونە بەو هەموو بەڵگە و نیشانە ڕوون و بەرجەستانەی تێیدایە هەر هەمووی بەڵگەی ژیرین لەسەر بوونی خوای گەورە ومیهرەبان، ئەم جیهانە بەرفراوانە بەوەی لەسەروو لەژێرەوە هەیە، لەو هەمووە مەلاین ئەستێرە درەوشاوە و جوانەی کە بەشێوەیەکی وورد ڕێکخراوون شاهیدی ئەوە دەدات کە پێویستە خالقێك ئەم دیمەنە جوان و ناوازەیەی خەلق کردبێت، وبەڕێوەی ببات، چونکە مەحاڵە گەردونێکی ڕێکوپێکی وەها بەبێ خالق و دروستکەرێك لەخۆیەوە و بەڕێکەوت هاتبێتە بوون، یان خۆی خۆی دروست کردبێت، خوای گەورە لەم بارەیەوە فەرمووویەتی : ﴿ أَمۡ خُلِقُواْ مِنۡ غَيۡرِ شَيۡءٍ أَمۡ هُمُ ٱلۡخَٰلِقُونَ ٣٥ أَمۡ خَلَقُواْ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَۚ بَل لَّا يُوقِنُونَ ٣٦ ﴾ [14] واتا : ئایا ئەو موشریك وهاوەڵ بڕیاردەرانە لەخۆیانەوە دروست بوون، یان ئایا خۆیان خۆیان دروستکردووە ﴿٣٥﴾

[14] سورة الطور: الآیتان 35- 36

وە ئایا ئەوان ئاسمانەکان و زەوییان بەو ڕێك وپێکیە دروستکردووە، نەخێر بەڵکو یەقینیان بەخواو بە ڕۆژی پاداشـــت و تۆڵـە نییە بۆیـە ئـاوا بــە ئارەزووی خۆیـان شەن ئەکەن ﴿٣٦﴾ .

هەر بۆیە جوبەیری کوڕی موطعیم (خوای لێ ڕازی بێت) پێش ئەوەی موسڵمان بێت کاتێك گوێی لەم ئایەتانە دەبێت دەڵێت : « كاد قلبي أن يطير » ([15]) واتا : خەریك بوو دڵم بفڕێت، ئەویش کاتێك کە ئیمان لەدڵ ودەروونیدا چەسپا و ئۆقرەی گرت، بۆیە دەبینین زۆر جار پەروەردگار ڕێنومایی بەندەکانی دەکات ئەویش لەڕێگای ڕێ نیشاندانیان لەناسین و وورد بوونەوە لەو بەڵگە ونیشانانەی کە لەنێو دروستکراوەکانی خوای گەورە لەدەوروبەر وگەردووندا بەدی دەکرێت، هــەروەك خــوای گەورە فــەرموویەتی : ﴿ وَفِي ٱلۡأَرۡضِ ءَايَٰتٞ لِّلۡمُوقِنِينَ ٢٠ ﴾ ([16]) واتا : لە زەوییدا گەلێ نیشانە و بەڵگەی گەورەو مەزن هەیە بۆ ئەوانەی لە ئیمان و لە بڕوادا بێگومانن، چونکە سەیری ئەو هەموو جۆرە گیاو گوڵ و ئاژەڵ و کێوو شــاخ و چیاو دەشت و دەرە ئەکەن، دەرئەنجام بەو شێوەیەش بۆخوا ملکەچ ئەبن، کەواتە سەرنج بدەن و تێڕامێنن لەو بەڵگە ونیشانانەی کە گەورەی دەسەڵاتی خوای گەورە دەسەلمێنن .

2) **بەڵگەی هەست ودەرکی مرۆڤ لەسەر بوونی خوای گەورە** ﷻ :

([15]) رواه البخاري في كتاب التفسير ، باب تفسير سورة الطور(4854).
([16]) سورة الذاريات: الآية 20.

مرۆڤ داوای ئەو شتانەی لە پەروەردگاری دەكات كە پێویستی پێیەتی ودەیەوێت لەدونیادا بەدەستیان بهێنێت ، بۆیە دەبینین هاوار دەكات و دەپاڕێتەوە ودەڵێت : ئەی پەررووەردگار، ئەی خوای بەرزوبڵند، داوای ئەو شتە دەكات كە دەیەوێت، زۆر نابات خوای گەورە داوا وپاڕانەوەكەی لێ وەردەگرێت، ئەو كەسە بەچاوی سەری خۆی دەیبینێت كە خوا هاتووە بەهاواریەوە، ئایا ئەمە بەڵگە نییە لەسەر بوونی خوای گەورە، ئەمەی كە ووتمان شتێكی بینراوە وهەست پێكراوە، بێباوەڕان و مولحیدەكانیش ناتوانن نكولی لێ بكەن، برادەرێكی بانگخوازم چیرۆكێكی جوان وقەشەنگی بۆ گێرامەوە، ووتی : كاتێك وویستمان بەفڕۆكە گەشتێك بكەین بۆ یەكێك لەووڵاتەكان، لەپڕ فڕۆكەكە شتێكی بەسەرهات، هەموو سەرنشینەكان بێگومان بووین كە تیاچووین ورزگار بوونمان مەحاڵە، منیش قورئانەكەم دەرهێنا و دەستم كرد بە قورئان خوێندن، كەسێكی مولحید ودوور لەدین هاتە پاڵمەوە، بە دەنگێكی بەرز پێی ووتم : قورئان خوێندنەكەت زیاتر بكە، زیاتر لێم نزیك بوویەوە وهاواری دەكرد : زیاتر زیاتر، دەنگت بەرز بكەرەوە، بەڵكو خوای گەورە ڕزگارمان بكات، ئەوە بوو سوپاس بۆ خوا ڕزگارمان بوو لەو مەترسی ودڵە ڕاوكێیە .

ئەم كارە هیچ جێگای سەرسوڕمان نییە، چونكە زۆرێك لە موشریك و بێباوەڕەكان پێشتر تووشی وەها هەڵوێستێكی ناخۆش بوون لە ژیانیاندا، ئەوەتانێ خوای گەورە لەوەصفیاندا دەفەرمووێت : ﴿ فَإِذَا رَكِبُوا فِي الْفُلْكِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ فَلَمَّا نَجَّاهُمْ إِلَى الْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ ﴿٦٥﴾ ﴾[17] واتا

---

([17]) سورة العنكبوت : الآية 65.

: لە کاتی خۆشیی و ئاسایشدا دەبینی ئەو خەڵکەیە بێ باوەڕن و نکوڵی قیامەت دەکەن، کەچی کاتێ سواری کەشتی ئەبن و ترسی نقوم بوونیان لێ دەنیشێت زۆر بەکوڵ سەر دائەنێن و ملکەچیی و یەکلابوونەوەی خۆیان بۆ خوا دەرئەبڕن و تەنها لەو داوا ئەکەن و، باسی بتەکان نامێنێ، بەڵام کاتێك ڕزگاریان دەکات و دەگەنە ووشکانیی، دووبارە دەچنەوە سەر بیرە پووچەڵەکەی خۆیان و بەهەمان جۆر شەریك و هاوەڵ بۆ خوا دادەنێن .

ئەمەش بەڵگەی هەست وناخی مرۆڤەکانە لەسەر بوونی خوای گەورە و پەروەردگار، ئەویش کاتێك بەڕوونی دەرکەوێت کە کاریگەریە ڕوپۆشەکان نەمێنن لەسەری، خێرا ئەو هەستە جارێکی تر چەکەرە دەکاتەوە و لە خوای خۆی دەپاڕێتەوە، بەڵام کاتێك ئەو کاریگەریە ڕوپۆشانە دەرکەوتنەوە وەك ئەوەی هیچی بەسەر نەهاتبێت، جارێکی تر وەك خۆی لێ دێتەوە ودەگەڕێتەوە سەر بێباوەڕییەکەی، خوا پەنا بدات .

### 3) بەڵگەی فیترەتی مرۆڤ لەسەر بوونی خوای گەورە ﷻ :

زۆربەی ئەو خەڵکەی کە فیترەتە پاك وخاوێنەکەیان تووشی لادان نەهاتووە وکاریگەری کەسانی تر لەسەریان کەم بووە، باوەڕیان بەخوای گەورە هەیە، تەنانەت ئاژەڵ وگیاندارەکانیش باوەڕیان بە بوونی خودا ویەکخواپەرستی ئەو ذاتە هەیە، وەك خوای گەورە فەرموویەتی :﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِىٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ ۛ شَهِدْنَآ ۛ أَن تَقُولُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَـٰذَا غَـٰفِلِينَ ﴿١٧٢﴾ أَوْ تَقُولُوٓا۟ إِنَّمَآ أَشْرَكَ ءَابَآؤُنَا مِن قَبْلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةً مِّنۢ بَعْدِهِمْ ۖ أَفَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ

ﭐلۡمُبۡطِلُونَ ١٧٣﴾[18] واتا : یادی ئەوکاتەش بکەرەوە کە پەروەردگارت پشتاو پشتی نەوەی ئادەمی کۆ کردەوە (لە جیهانی پەنهان و شاراوەدا پەیمانی لێ وەرگرتن) و کردنی بە شایەت بەسەر خۆیانەوە و (پێی فەرموون): ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟! هەموو ووتیان: نابێت تۆ خوای ئێمە نەبیت، بەڵێ شایەتیمان داوە (کە تۆ پەروەردگارمانیت)، ئەمەش بۆ ئەوەی نەوەکو لە ڕۆژی قیامەتدا بڵێن: بەڕاستی ئێمە لەمە بێئاگا بوین ﴿١٧٢﴾ یاخود نەوەک بڵێن: جا ئێمە چی بکەین، بەڕاستی باوو باپیرانمان لە پێشدا هاوەڵیان بۆ خوا داناوە و ئێمەش نەوەیەک بووین دوای ئەوان هاتین و شوێنیان کەوتین، جا ئایا تۆ لەناومان دەبەیت بەهۆی ئەوەی کە پێشێلکەرانی حەق کردوویانە ﴿١٧3﴾ ؟

ئەم ئایەتانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی مرۆڤ لەسەر فیترەتێکی پاکی بێگەرد خوای گەورە دروستی کردووە، فیترەتێك کە باوەڕی بەوە هەیە کە پێویستی بە کەسێك هەیە هەمیشە هاواری بۆ لاببات و لێی بپاڕێتەوە، چونکە مرۆڤ وا دروستکراوە ناتوانێت بە بێ باوەڕ بون بە خوایەکی تاك و تەنها بژیەت، ئەو کەسانەشی کە ئینکاری ئەمە دەکەن، درۆ وبوهتانەکانیان کاتێك دەردەکەوێت کە تووشی نارەحەتی وبەڵا وناخۆشیەك دەبن لەژیانیاندا، کاتێك زانیان هەموو دەرگاکانیان لەسەر داخراوە، ئەوجا ئەو فیترەتەی کە لەسەر دروستکراوە سەر هەڵ دەدات و هاوار لەخوای خۆی دەکات، وەك لە بەڵگەی پێشووتردا ڕوونمان کردەوە .

---

([18]) سورة الأعراف : الآيتان 172-173 .

**4) بەڵگە شەرعیەکان لەسەر بوونی خوای گەورە ﷻ :**

خوای گەورە پێغەمبەرەکانی ڕەوانە کرد بۆ لای گەلەکانیان هەریەکە بە شەریعەتێکی تایبەتی خۆیەوە، شەریعەتێك کە بۆ سەرجەم دروستکراوەکانی خوا بگونجێت، شەریعەتێك لەگەڵ داواکاری ئەو گەلانەدا پێك دەهاتەوە، بەتایبەتی شەریعەتی ئیسلام و قورئانی پیرۆز کە تائێستاشی لەگەڵدا بێت هەموو مرۆڤایەتی دەستەوسان بوون لەبەرامبەریدا کە بتوانن وەك قورئان یان نمونەی قورئان بهێنن، هەموو ئەمانە بەڵگەن لەسەر بوونی خوایەکی دانای زانای کار بەجێ، خوایەك کە دروستکراوەکانی خۆی دروستکردووە، هەر ئەویش دەزانێت چی جۆرە بەرنامەیەکیان پێویستە، چی جۆرە بەرنامەیەك بەکەڵکی ژیانی ڕۆژانەیان دێت .

هەموو ئەم ئاژەڵ و زیندەوەر وچیا وڕووبار ودەریا وزەریا ودرەخت وئەستێرە و مانگ وخۆر وگەردوونە، بەڵگەن لەسەر بوونی خوای گەورە، سەرە ڕای بەڵگەکانی تری وەك جیاوازی زمان و ڕەنگ وپێست و ڕادەی ژیری نێوان مرۆڤەکان، جوانی شێوە و ڕوخساریان، ڕێکخستنی ئەندامەکانی لەش بەم شێوە جوانەی ئێستا، هەموو بەڵگەی ڕوون وئاشکران لەسەر بوونی خوا وگەورەیی دەسەڵاتی ئەو ذاتە پیرۆزە بۆ کەسانێك کەمێك بیر بکەنەوە تێبفکرن لەوەی لەچوار دەوریان ڕوو دەدات ودەگوزەرێت، خوای گەورەش هەر لەکۆنەوە فەرموویەتی : ﴿ وَفِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ أَفَلَا تُبۡصِرُونَ ٢١ ﴾[19] واتا : لەخودی خۆیشتاندا (لەهەموو خانەیەکی لەشدا، لەهەموو ئەندامێکدا،

---

(19) سورة الذاريات : الآية 21.

لەهەموو کۆئەندامێکدا، لەرۆح ونەفس و عەقڵدا، بەڵگەی بێ سنوور هەیە لەسەر زانایی و بەتوانایی و جوانکاری زاتی بەدیهێنەر) دەسا لە خۆتان نارِوانن و تەماشا ناکەن ؟ سەیر ناکەن خوای گەورەچۆن ئێوەی دروست کردووە، هەریەکە شێوەی ئاخافتن و زمانی جۆرێکە، رەنگ و روخساری جۆرێکە، پلەی ژیریی و تێگەیشتنی و بەژن و باڵاو قەدو قامەتی جۆرێکە ؟ .

**دووەم : باوەڕ بوون بەخوای گەورە، یەکخواپەرستی لە پەرستنەکاندا دەگەیەنێت،** مەبەست ئەوەیە بەدڵت باوەڕت پێی هەبێت، و بەزومان دانی پێدا بنێیت، کە پەروەردگار خوایەك وپەرستراوێکی بەهەقە، هیچ شەریك وهاوەڵی نییە لەپەرستندا، وە هەموو ئەو شتانەشی کە جگە لە ئەو دەپەرسترێت هەر هەمووی خوای بەتاڵ وپڕوپووچ ودروستکراوی دەستی مرۆڤەکانە، لەم بارەیەشەوە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ هُوَ ٱلۡبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡكَبِيرُ ٦٢ ﴾ [20] واتا : ئەمە لەبەر ئەوەیە بەڕاستی هەر خوا هەق و ڕاستە وە بێگومان ئەوەی جگە لە خوا هاواری لێ دەکەن و (دەیپەرستن) هەر هەمووی بەتاڵ و ناڕاستە، وبێگومان خوا هەر خۆی بەرزو بڵندو گەورەیە .

باوەڕ بە یەکخواپەرستی پەروەردگار لەپەرستندا ئەوە دەخوازێت کە بەندەکان هیچ جۆرە پەرستنێك بۆ غەیری ئەو ذاتە پیرۆزە ئەنجام نەدەن، چونکە هەر ئەو پەرستراوی بەهەقە، شایانی ئەوەیە بەندەکان هەموویان بەتاك و تەنهایی هەر ئەو بپەرستن، وعیبادەتەکانیان هەر بۆ ئەو بێت ،

---

(20) سورة الحج : الآية 62.

عیبادەتی دڵەکانیان، عیبادەتی زومانیان، عیبادەتی کاروکردەوە وئەندامەکانی تری جەستەیان، خوای گەورەش فەرموویەتی : ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ٢١ ﴾ [21] واتا : ئەی خەڵکینە! تەنها پەروەردگاری خۆتان بپەرستن، کە ئێوەو پێشووەکانی ئێوەی لەنەبوون دروستکردووە، چونکە ئاوا پەرستنێك هێزی پارێزگاری دروست دەکات و بەڵکو ئێوەش خۆ بپارێزن .

هەروەها فەرموویەتی :﴿ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ ﴾ [22] واتا: پەروەردگارت بڕیاری داوە کە هیچ شتێك نەپەرستن بێجگە لە ئەو .

پێغەمبەریش ﷺ لەفەرموودەیەکی قودسیدا دەفەرمووێت : { قَالَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: أَنَا أَغْنَى الشُّرَكَاءِ عَنِ الشِّرْكِ مَنْ عَمِلَ عَمَلاً أَشْرَكَ فِيهِ مَعِي غَيْرِي تَرَكْتُهُ وَشِرْكَهُ } [23] واتا: خوای گەورە فەرموویەتی من دەوڵەمەندترین کەسێکم کە پێویستم بە شەریك وهاوەڵ نییە، هەرکەسێك کارێك بکات وجگە لەمن کەسێکی تر لەگەڵمدا بکاتە هاوبەش و شەریکم، ئەوە من خۆی و شیرك وهاوەڵ بڕیاردانەکەی بەجێ دەهێڵم و ( نامەوێت ) .

بۆیە پێویستە لەسەر بەندەکان هیچ پەرستنێك بۆ غەیری خوا ئەنجام نەدەن، ئیتر ئەو پەرستنە سەربڕینی ئاژەڵ وگیاندارێك بێت، یان نزا وپاڕانەوە وهاوار لێکردن و وپاڕانەوە بێت، یان ملکەچی

---

[21] سورة البقرة : الآية 21 .

[22] سورة الإسراء: الآية 23.

[23] رواه مسلم في كتاب الزهد، باب من أشرك في عمله غير الله (2298).

وترس و خشوع ونوێژ وڕۆژوو زەكات و حەج بێت، یان هەر پەرستنێكی تر لەپەرستنەكان، كە هەر هەمووی دەبێت بۆ خوای تاك وتەنها بیت، وبەهیچ شێوەیەك ناكرێت بۆ غەیری ئەو ئەنجام بدرێن، چونكە ئەنجامدانی هەر جۆرە پەرستنێك بۆ غەیری خوا دەچێتە چوار چێوەی شیرك وهاوەڵ بڕیاردانەوە .

## سێهەم : باوەڕ بوون بەخوای گەورە، یەكخواپەرستی لەناوە جوان و صیفەتە پیرۆزەكانی دەگەینێت :

باوەڕ بوون بەناو صیفەتە پیرۆزەكانی خوای گەورە، بەوە دەبێت ئەو ناو صیفەتانەی كە خوا وپێغەمبەرەكەی ﷺ لەقورئان و سوننەتدا ثابت وجێگیریان كردووە، ئێمەیش بەشێوەیەكی جوان و شایستە بۆ خوای گەورەی بڕیار بدەین، بەبێ دەستكاری كردن و لەكارخستن و لێكچواندن ولێكدانەوەی نابەجێ، خوای گەورە لەبارەی ناو وصیفەتە جوانەكانی فەرموویەتی : ﴿وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا﴾ ([24]) واتا : ناوەكانی خوا هەموو جوان و پڕشكۆن، و پەروەردگار خاوەنیانە، بەو ناوانە دۆعا و نزا بكەن و هاناو هاوار بۆ ئەو ذاتە پیرۆزە بەرن .

بۆیە لەسەر بەندەكان واجبە هەست بە پیرۆزی ئەو ناوە وصیفەتە بەرز وبڵندانە بكەن، و لەدڵ و دەروون و ناخیاندا ڕەگ داكوتن، بەو ناو و صیفەتە جوانانە هاوار لە پەروەردگاریان بكەن، چونكە

([24]) سورة الأعراف : الآية 180.

باوەڕ بەم ناو صیفەتانە خۆشەویستی و ترس و خشوع لەدڵەکاندا بەرامبەر بە خوای گەورە دەڕوێنن

.

## بەرهەم و شوێنەواری باوەڕ بوون بە خوای گەورە : ﷻ

باوەڕ بەخوای گەورە ﷻ بەرهەم و شوێنەوارێکی گەورەی هەیە :

1) جێبەجێکردن و تەحقیق کردنی یەکخواپەرستی ذاتی پیرۆزی (الله) بەشێوەیەك کە دڵی بەندەکان پابەند نابن بەغەیری خوداوە .

2) ئەو پەڕی خۆشەویستی ومەحبەت بۆ خودا و بەگەورە وشکۆ ڕاگرتنی، لەڕوانگەی باوەڕ بوون بەناو وصیفەتە بەرز و جوانەکانی .

3) جێبەجێ کردن و تەحقیق کردنی سەرجەم پەرستنەکان تەنها بۆ ذاتی پیرۆزی ( الله ) ئەویش بەوەی سەرجەم فەرمانەکانی جێبەجی بکەیت، ودووریش بکەویتەوە لەو شتانەی قەدەغە و نەهی کردون .

4) ئازادکردنی بەندەکانە لە بەندایەتی کردنی دروستکراوەکانی خودا وترس و ڕەجا وکارکردن لەبەر ڕەزامەندی ئەوان و پابەند بوون پێوەیان، بۆ بەندایەتی کردنی خوای تاك و تەنها، چونکە هەر بەندایەتی ڕاستەقینەی خودای تاك و تەنهایە مرۆڤەکان لەزەلیلی ڕزگار دەکات، و سەربەرزیان دەکات بە پابەند بوون بە پەروەردگاری ڕاستەقینەی خۆیانەوە .

## دووەم : باوەڕ بە فریشتەكان

**فریشتەكان كێن ؟** فریشتەكان جیهانێكی نادیارن، خوای گەورە لە نوور دروستی كردوون، بەشێوەیەكی وا كە هەمیشە گوێڕایەڵی ئەون وسەرپێچی ناكەن ولەفەرمانەكانی دەرناچن، وە هەریەكێكیش لەوان خوای گەورە تایبەتی كردووە بە كارێكەوە كە پێی سپاردووون، بۆ نموونە جوبرەئیلی تایبەت كردووە بە وەحی هێنان بۆ پێغەمبەران ونێرراوەكانی، وە ئیسرافیلی تایبەت كردووە بە فووكردن بە كەڕەنا (صور) دا، هەروەها یەكێكیشە لەو هەشت فریشتەی كە عەرشی خوایان هەڵگرتووە، وە میكائیلی تایبەت كردووە بە باران و ڕووەكەكانەوە، وە هەندێكی تریشی (وەك فریشتەی مردن و یارمەتیدەرەكانی ) تایبەت كردووە بە كێشانی گیانی مرۆڤ و گیان لەبەرەكانی ترەوە، جگە لەمانەیش كۆمەڵێكی زۆری تر هەن لە فریشتەكان كە خوای گەورە ڕای سپاردوون بە كارێكەوە .

## ئایا چۆن باوەڕ بە فریشتەكان دەهێنیت ؟

1 ) باوەڕمان وایە كە فریشتەكان جیهانێكی نادیار وغەیبین، ودەكرێت ببینرێن، بەڵام ئەصڵ وایە كە نابینرێن، خوای گەورە ئەوانی لە نوور دروستی كردووە، تەواو گوێڕایەڵی پەروەردگارن و بە هیچ شێوەیەك لەفەرمانی دەرناچن، خوای گەورەش فەرموویەتی :

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ عَلَيۡهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٞ شِدَادٞ لَّا يَعۡصُونَ

ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ ٦﴾ [25] واتا : ئەی ئەو کاسانەی کە باوەڕتان هێناوە خۆتان و کەسوکارتان بپارێزن لە ئاگرێك کە سووتەمەنیەکەی خەڵکی و بەردە، سەرپەرشتیاری ئەو دۆزەخ و ئاگرە، جۆرە فریشتەیەکن کە زۆر دڵڕەق و توند و تیژن، نافەرمانی خوا ناکەن لە هیچ شتێکدا کە فەرمانیان پێ بدات و هەرچی فەرمانێکیان پێ بدرێت ئەنجامی دەدەن .

2) باوەڕمان بەو ناوانەیان هەیە کە لەقورئان و سوننەتدا ناویان هاتووە، وە بەو کارو فەرمانانەیش کە پێیان سپێردراوە وپێشتر باسمان کردن .

**بەرهەم و شوێنەواری باوەڕ بە فریشتەکان :**

1) تێگەیشتن لەهێز ودەسەڵاتی خوای گەورە ﷻ .

2) شوکر و سوپاسی خوا کردن لەسەر گرنگی دانی بە بەندەکانی، بەوەی ئەو فریشتەکانی ڕاسپاردووە بەهەڵسوڕانی کاروباریان و پارێزگاری لێکردنیان .

3) خۆشەویستنی فریشتەکان، بەوەی کە هەڵدەستن بە بەندایەتی کردنی [26] .

(25) سورة التحريم : الآية 6.

(26) محاضرات في العقيدة والدعوة، للشيخ صالح الفوزان (281/1).

## سێهەم : باوەڕ بە کتێبە ئاسمانییەکان

باوەڕ بە کتێبە ئاسمانییەکان بەوە دەبێت، کە باوەڕی تەواومان هەبێت کە ئەو کتێب و پەڕاوە ئاسمانیانە هەر هەموویان لە لایەن خوای گەورەوە بەهەق دابەزیوون بۆ سەر پێغەمبەرەکانی، کە ڕێنیشاندەر و ڕێنوماکەری خەڵکی بن، وە باوەڕ بەوەیش هەموو ئەو پەڕاو و کتێبە ئاسمانییانە کەلام و گوفتاری خودای بە دەسەڵاتن .

### ئەوەی باوەڕ بە کتێب و نامە و پەڕاوە ئاسمانییەکان دەیخوازێت :

1) باوەڕ بەوەی دابەزینیان لە لایەن خوای گەورەوە بووە .

2) باوەڕ بەو ناوانەی کە خوای گەورە فێری کردووین لەناویان، وەك قورئانی پیرۆز کە بۆ محمد ﷺ دابەزیووە، وە تەورات کە بۆ موسی عليه السلام دابەزیووە، وە ئینجیل کە بۆ عیسی عليه السلام دابەزیووە، وە زەبور کە بۆ داود عليه السلام دابەزیووە، وە ( صحف ) کە خوای گەورە ناردوویەتی بۆ ئیبراهیم عليه السلام، وە باوەڕ بە شێوەیەکی گشتی بەو نامە و پەڕاوە ئاسمانییانەشی کە بۆ پێغەمبەرانی تر هاتوون و ئێمە ناویان نازانین .

3) بەڕاست زانینی ئەو هەواڵ و بەسەرهاتانەی کە ئەو کتێب و پاڕاوە ئاسمانیانە باسیان کردوون، وەك ئەوەی لەقورئاندا بۆمان باسکراوە، یان ئەوەی لە کتێب و پەڕاوە ئاسمانیەکانی تردا هاتووە، پێش ئەوەی دەستیان تێبخرێت و بشێوێنرێن .

4) کارکردن بە حوکمەکانیان و ڕازی بوون و تەسلیم بوون پێیان، ئەگەر هاتوو ئەو حکومانە نەسڕابنەوە و نەسخ نەبووبنەوە، وە ئاشکرایە حوکمی سەرجەم کتێب و نامە وپەڕاوە ئاسمانیەکان بە قورئانی پیرۆز نەسخ بوونەتەوە وسڕاونەتەوە، وەك خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَمُهَيۡمِنًا عَلَيۡهِ ﴾[27] واتا : ئێمە قورئانمان هاوڕێ لەگەڵ هەموو حەقیقەت و ڕاستیەکدا بۆ تۆ دابەزاندووە، ڕاستی و دروستی کتێبەکانی پێش خۆیشی دیاری دەکات و چاودێر وحاکمە بەسەر هەموویانەوە .

بەم پێیشە دروست نییە کارکردن بەهیچ حوکمێك لەو حوکمانەی کە لە کتێب و نامە ئاسمانیەکانی تردا هاتوون، جگە لەو حوکمانە نەبێت کە ڕاست و دروستن ودوور بوون لە شێواندن و دەستێخستن، وقورئانی پیرۆزیش دانی پێداناوە .

**بەرهەم و شوێنەواری باوەڕ بە کتێب و نامە و پەڕاوە ئاسمانیەکان :**

1) تێگەیشتن لەوەی کە خوای گەورە گرنگی تەواوی داوە بە بەندەکانی، بەوەی هەموو گەلێك کتێب وپەڕاوێکی بۆ ناردوون بۆ هیدایەتدان وڕێنموونی کردینان .

2) تێکەیشتن وشارەزا بوون لە حیکمەت ودانایی خوای گەورە، بەوەی هەموو گەلێك شەریعەت و یاسا وڕێسایەکی تایبەتی بۆ ناردوون، کە بگونجێت لەگەڵ حاڵ و گوزەرانیاندا، وەك خوای

(27) سورة المائدة : الآية 48.

گەورە فەرمووییەتی : ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ﴾[28] واتا : بۆ هەریەکێ لەئێوەش ئەی موسڵمانان و ئەهلی کیتاب! یاساو بەرنامەیەکمان دانا، بۆئەوە کاری پێبکەن و لێی لانەدەن، واتا: پلە بەپلە بەدوای یەکدا کتێب وبەرنامەمان بۆناردن، هەتا کۆتا بەرنامە (قورئانی پیرۆز) ئیتر پاش هاتنی ئەو، دەبێت هەموو لەدەوری خڕ ببنەوەو، کار هەربەو بکەن .

3) سوپاسی خوا کردن لەسەر ئەم نیعمەتە گەورەیەی خوای گەورە ڕژاندویەتی بەسەر نەوەکانی ئادەمدا، بەوەی هەروەها دروستی نەکردوون و پشتگوێیان بخات، بەڵکو بۆ هەر گەلیك کتێب و نامە و پەڕاوێکی تایبەتی نادرووە .

(28) سورة المائدة : الآية 48.

## چوارەم : باوەڕ بە پێغەمبەران و فروستادەکانی خوای گەورە

پێغەمبەران کێن ؟ پێغەمبەرەکان ئەو کەسانەن کە خوای گەورە هەڵیبژاردوون بۆ ئەوەی هۆکار و ناوەندگیرێك بن لەنێوان خۆی و بەندەکانیدا، ئەویش لەپێناو گەیاندنی ئەوەی کە پێی ڕاگەیاندوون لەشەریعەت و وەحی و فەرمان و واجبەکانی سەرشانیان بەرامبەر بە خوای گەورە، یەکەم پێغەمبەریش (نوح ﷺ) بوو، وە کۆتا پێغەمبەریش (محمد) پێغەمبەری ئیسلام بووە ﷺ، خوای گەورە لەم بارەیەوە فەرموویەتی :﴿إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦٓ أَنۡ أَنذِرۡ قَوۡمَكَ مِن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ١﴾ [29] واتا : بە ڕاستی ئێمە (نووح) مان نارده لای هۆزەکەی، و فەرمانمان پێدا: هۆزەکەت بترسێنەو هۆشیاریان بکەوە، پێش ئەوەی سزایەکی ئێش پێگەیەنەری سەختیان بۆبێت لەلایەن پەروەردگاریانەوە .

وە هەروەها فەرموویەتی : ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٖ مِّن رِّجَالِكُمۡ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ﴾ [30] واتا : محمد ﷺ باوکی هیچ پیاوێکتان نییە، نە زەید و نە کەسی دیکەتان هەتا حەرام بێت ژنی بە کوڕکراوی خۆی- پاش تەڵاقدانی- مارەبکات، چونکە کچ وکوڕی ئەو ئاشکران, و بێ لەوان کەسیتر نابێتە کچ وکوڕی، بۆیە دەتوانێ ژنەکەی زەید مارە بکات, بەڵکو ئەو پەیامبەری خوایە و دواهەمینی پەیامبەرانە، کۆتایی زنجیرەی پەیامبەرانی پێهاتووە.

---

(29) سورة النوح : الآية 1 .
(30) سورة الأحزاب : الآية 40.

پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) مرۆڤ بوون وەك هەموو مرۆڤەکانی تر، تەنها هێندە جیاوازیان هەبووە کە خوای گەورە وەحی و نیگای بۆ کردوون، وەك فەرموویەتی : ﴿ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَـٰهُكُمْ إِلَـٰهٌ وَٰحِدٌ ﴾ (31) واتا : ئەی پێغەمبەر ﷺ پێیان بڵێ: دڵنیابن کە من هەر بەشەرێکم وەک ئێوە، (جیاوازیەکە تەنها ئەوەیە) من وەحی ونیگام بۆ دەکرێت کە بێگومان خوای ئێوە خوایەکی تاک و تەنهایە .

وە بەهیچ شێوەیەك دروست نییە هیچ جۆرە عیبادەت وپەرستنێك بۆ پێغەمبەران بکرێت، وەك پاڕانەوە و داوای شت لێکردنیان، هەروەك چۆن دروست نییە نەذریان بۆ بکرێت و ئاژەڵیان بۆ سەر ببرِدرێت، خوای گەورەش لەم بارەیەوە فەرموویەتی : ﴿ قُل لَّآ أَمْلِكُ لِنَفْسِى نَفْعًا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ۚ وَلَوْ كُنتُ أَعْلَمُ ٱلْغَيْبَ لَٱسْتَكْثَرْتُ مِنَ ٱلْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِىَ ٱلسُّوٓءُ ۚ إِنْ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ١٨٨ ﴾ (32) واتا : ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: کە من ناتوانم هیچ قازانج یان زەرەرێک بەخۆم بگەیەنم، مەگەر ویستی خوای لەسەربێت، خۆ ئەگەر غەیب و شاراوەکانم بزانیایە ئەوە چاکەی زۆرم کۆدەکردەوە بۆخۆم و هیچ ناخۆشیەکیشم تووش نەدەبوو، من هیچ شتێک نیم تەنیا ترسێنەرێک (بۆ یاخیەکان) و مژدەدەریشم بۆ کەسانێک کە باوەڕ دەهێنن .

**ئەوەی باوەڕ بە پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) دەیخوازێت :**

(31) سورة فصلت الآية : 6 .
(32) سورة الأعراف : الآية 188.

بـاوەڕ بە پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) چوار شت دەخوازێت :

1) پەیامەکانیان هەق وڕاستن ولە لایەنی خوای گەورەوە نێرراون، هەرکەسێك بێباوەڕ بێت بە یەکێك لەو پێغەمبەرانە، ئەوە با بزانێت بێباوەڕ بووە بەسەرجەم پێغەمبەران، گاورەکان کاتێك باوەڕیان نەهێنا بە پێغەمبەری ئیسلام محمد ﷺ وشوێن پەیامەکەی نەکەوتن، ئەوە خۆی لەخۆیدا ئەوە دەگەیەنێت کە عیسی کوڕی مەریم ﷺ یان بەدرۆ خستوەتەوە، چونکە ئەگەر ڕاستیان بکردایە شوێن محمد ﷺ دەکەوتن، لەبەر ئەوەی عیسی ﷺ موژدەی هاتنی پێغەمبەری ئیسلامی بە گاورەکان دابوو .

2) باوەڕ بەو پێغەمبەرانەی ناویان دەزانین، وەك محمد و ئیبراهیم و عیسی و موسی و نوح و سەرجەم ئەو پێغەمبەرانەی کە لەقورئاندا ناویان هاتووە، کە ژمارەیان بیست وپێنج پێغەمبەرن، وە باوەڕیش بە شێوەیەکی گشتی بەوانەشیان کە ناویان نەهاتووە .

3) باوەڕ بوون و بەڕاست زانینیان لەو شتانەی هەواڵیان پێداوە و گێڕاویانەتەوە .

4) کارکردن بە شەریعەتی ئەو پێغەمبەرەی خوای گەورە و پەروەردگار ڕەوانەی کردووە بۆلامان، ئەویش محمد ﷺ ـە، کە کۆتا و خاتەمی پێغەمبەرانە .

**بەرهەم و شوێنەواری باوەڕ بە پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) :**

1) تێگەیشتن وشارەزا بوون لە ڕەحمەت ومیهرەبانی خوای گەورە بەرامبەر بە بەندەکانی، بەوەی بۆ هەموو گەل و هۆزێك پێغەمبەرێکی بۆ ناردوون، بۆ ئەوەی ڕێنیشاندەریان بێت بۆ سەر ڕێگای

ڕاست، و چۆنیەتی بەندایەتی وپەرستنی خوای گەورە، بەو شێوەیەی کە پەروەردگار دیاری کردووە .

2) شوکر و سوپاسی خوای گەورە کردن لەسەر ئەم نیعمەتە گەورەیەی کە بەخشیویەتی بە بەندەکانی .

3) خۆشویستنی سەرجەم پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) و بە گەورە ڕاگرتنیان لەو سنوورەی خوا دیاری کردووە، وە سەلام و صەڵاوات دان لەسەریان لەکاتی ناوهێنانیان .

## پێنجەم : باوەڕ بە ڕۆژی دوایی:

مەبەست لە ڕۆژی دوایی، ڕۆژی قیامەتە، ئەو ڕۆژەی کە خوای گەورە سەرجەم خەڵکی زیندوو دەکاتەوە بۆ لێپرسینەوە و حساب لەگەڵ کردنیان، بۆ ئەوەی سزای بێباوەڕان وخراپەکاران بدات، و پاداشتی باوەڕداران و چاکەکرانیش بداتەوە، وە ناونراوە ڕۆژی دوایی، چونکە ئیتر لەپاش هاتنی ئەو ڕۆژە ئیتر ڕۆژێکی تر نایەت، واتا : ژیان هەتا هەتایی دەبێت، بەشێوەیەك ئەهلی بەهەشت لەجێگا وشوێنی خۆشی خۆیان جێگیر دەبن، و ئەهلی دۆزەخیش ( خوا پەنامان بدات ) بە جێگای نارەحەتی خۆیان جێگیر دەکرێن، خوای گەورەش فەرموویەتی:﴿وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ﴾ ([33]) واتا : کرداری چاك و کاری باش بریتیە لەوەی کە ئادەمیزاد باوەڕی هێنا بێت بە خوا و بە ڕۆژی دوایی و بە فریشتەکان و بەکتێبەکان و بە پێغەمبەران ... وە فەرمووشیەتی :﴿عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ ([34]) واتا : ئەوانەی بڕوایان بەو قورئان و کتێبە هەیە بۆتۆ دابەزێنراوە, وە بەو کتێب و نامە ئاسمانیانەش کە پێش تۆ بۆ پێغەمبەران دابەزێنراون، وە بڕوای بەهێز و یەقنیشیان بە هـــاتنی ڕۆژی دوایی هەیە .

---

([33]) سورة البقرة : الآية 177.
([34]) سورة البقرة: الآية 4.

باوەڕ بە ڕۆژی دوایی بنەمای پێنجەمە لە بنەماکانی ئیمان وباوەڕ، هەر کەسێك بەدرۆی بزانێت و باوەڕی پێی نەبێت، ئەوە با بزانێت کافر بووە، چونکە خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿ زَعَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَن لَّن يُبۡعَثُواْۚ قُلۡ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتُبۡعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلۡتُمۡۚ وَذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ٧ ﴾[35] واتا : ئەوانەی بێ باوەڕ بوون بە بۆچوونی خۆیان وتیان : هەرگیز زیندوو ناکرێنەوە، پێیان بڵێ: وا نیە، سوێند بە پەروەردگارم، بەڕاستی هەر زیندوو دەکرێنەوە، پاشان ئاگادار دەکرێن لە هەموو ئەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامتان دەدا، ئەوەش بۆ خوا زۆر ئاسان وسادەیە .

### ئەوەی باوەڕ بە ڕۆژی دوایی دەیخوازێت :

باوەڕ بە ڕۆژی دوایی هەندێك شت دەخوازێت لەوانەیش :

1) باوەڕ بە لێپرسینەوە و سزا وپاداشت وەرگرتنەوە، بەوەی خوای گەورە بە پێی کار وکردەوەی بەندەکانی لێپرسینەوەیان لەگەڵدا دەکات، وە هەموو کەس پاداشت و سزای خۆی وەردەگرێت بەبێ ئەوەی بە ئەندازەی گەردیلەیەك زوڵم و ستەمیان لێ بکرێت، خوای گەورەش لەبارەی لێپرسینەوەی بەندەکانەوە فەرموویەتی :﴿ إِنَّ إِلَيۡنَآ إِيَابَهُمۡ ٢٥ ثُمَّ إِنَّ عَلَيۡنَا حِسَابَهُم ٢٦ ﴾ [36] واتا : بێگومان ئەوانە گەڕانەوەیان هەر بۆ لای ئێمە (بیانەوێت یان نەیانەوێت) ﴿٢٥﴾ لەوەودوایش بەڕاستی حیساب و لێپرسینەوە و دادگاییان لەسەر ئێمەیە ﴿٢٦﴾ .

---

(35) سورة التغابن: الآية 7.
(36) سورة الغاشية : الآيتان 25. 26.

2) باوەڕ بە بەهەشت و بە دۆزەخ، باوەڕ بەوەی ژیانی دواڕۆژ ژیانی هەمیشەییە، خوای گەورە بەهەشتی ئامادە كردووە بۆ خواناسان و پارێزكاران و موخلصین وگوێڕایەڵەكانی، وە دۆزەخیشی داناوە بۆ بێباوەڕان ودووڕووەكان وكەسانی خراپەكار وسەرپێچی كەر، خوای گەورە لەبارەی جێگا وشوێنی خواناسانەوە لە دواڕۆژدا فەرموویەتی : ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ خَيۡرُ ٱلۡبَرِيَّةِ ٧ جَزَآؤُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ ذَٰلِكَ لِمَنۡ خَشِيَ رَبَّهُۥ ٨ ﴾ ([37]) واتا : بەڕاستی ئەوانەش وا ئیمان و بڕوایان هێنا، و كارە چاكەكانیان ئەنجامدا، ئائەوانە چاكترینی هەموو دروستكراوەكانی سەر زەویین ﴿٧﴾ پاداشتیان لای پەروەردگاریان بەهەشتی پڕ لە باخی چڕە (كە كۆشك و تەلارەكان تیایدا ون بوون)، چەندەها ڕووباریش بەژێر درەخت و بەبەردەم كۆشكەكانیدا دەڕوات و لەوێ ژیانی هەمیشەیی و بەردەوام بۆ هەتا هەتایی دەبەنە سەر، ئەوانە خوا ڕازیە لێیان، ئەوانیش لەو ڕازین (چۆن ڕازی نابن ئەی پەروەردگاری ئازیز، بەڕاستی نازانین بەچ زمانێك سوپاسگوزارت بین) بێگومان ئەو ڕێزو قەدرە بۆ ئەو كەسەیە كە لە پەروەردگاری ترساوەو فەرمانەكانی بەجێهێناوە ﴿٨﴾.

هەروەها فەرموویەتی :﴿ وَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِيٓ أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ ١٣١ ﴾ ([38]) واتا : خۆتان بپارێزن لەو ئاگرەی كە ئامادە كراوە بۆ بێ بڕواكان، لەجێگەیەكی تردا فەرموویەتی :﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَعَنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ

---

([37]) سورة البينة : الآيتان 7، 8.

([38]) سورة آل عمران : الآية 131.

﴿وَأَعَدَّ لَهُمْ سَعِيرًا ﴿٦٤﴾ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا لَّا يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿٦٥﴾﴾ (39) واتا : بەڕاستی خوا نەفرینی لە بێ باوەڕان كردووە و ئاگری هەڵگیرساوی بۆ ئامادە كردوون ﴿٦٤﴾ بەهەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە هیچ پشتیوان و یاری دەدەرێكیان نییە ﴿٦٥﴾ هەندێ باس و بابەتی تریش هەیە كە پەیوەندی بە ڕۆژی دواییەوە هەیە حەزمان كرد ئاماژەیەكیان پێ بدەین، ئەگەر بەشێوەیەكی كورتیش بێت، وەك باوەڕ بەو ڕووداوانەی كە لەپاش مردن ڕوو دەدەن، بۆ نموونە :

1) تاقیكردنەوەی ناوگۆڕ : مەبەست پێی ئەو پرسیارانەیە كە لەمردوو دەكرێت پاش ناشتنی، وەك پرسیاركردن لە پەروەردگاری، لە ئاینی، لە پێغەمبەرەكەی، ئەوەی باوەڕدار بێت دەڵێت : پەروەردگارم ( الله ) یە، وە ئاینیشم ئیسلامە، و پێغەمبەریشم محمد ﷺ ــە، بەڵام ( خوا پەنا بدات ) ئەوەی بێباوەڕ بێت، دەڵێت : ها ... ها نازانم .

2) باوەڕ بە سزا و خۆشیەكانی ناوگۆڕ: ئەو كەسانەی ئەهلی باوەڕ بووبن لەناو گۆڕەكانیاندا خوای گەورە خۆشبەخت وبەختیاریان دەكات، و هێندەی چاوبڕبكات خوای گەورە گۆڕەكانیان بۆ فراوان دەكات، وهەموو كەسێكیان جێگەكەی خۆی پیشان دەدرێت لە بەهەشتدا.

ئەوەیشی بێباوەڕ و ستەمكار و دووڕوو بێت خوای گەورە لەناو گۆڕەكانیان سزایان دەدات، و ئەو گۆڕانەیان لێ تەسك دەكرێتەوە، وپڕیش دەكرێن لەئاگر، وە هەر كەسێكیش لەوان جێگەكەی خۆی لە ناو دۆزەخدا پێ نیشان دەدرێت ( پەنا بەخوای گەورە ).

(39) سورة الأحزاب : الآيتان 64- 65.

**بەرهەم و شوێنەواری باوەڕ بە ڕۆژی دوایی:**

1) حەزکردن لەتاعەت و گوێڕایەڵی کردنی فەرمانەکانی خوای گەورە و سوور بوون لەسەریان، وە پەشیمان بوونیش لەدەستدانی ئەو خێر وچاکانەی لەدەستت چوون .

2) ترسان لەتاوان و سەرپێچی کردنی خوای گەورە، چونکە سەرەنجامەکەی سووتانە بەئاگری دۆزەخ، ئەگەر خوای گەورە لێی خۆش نەبێت .

3) دڵخۆشیدانەوەیە بۆ کەسانی باوەڕدار، لەبەرامبەر ئەو شتانەی لەدونیادا لەدەستیان چوون، بە ئومێدی ئەوەی خوای گەورە لە دوارۆژدا پێیان ببەخشێت، و بۆیان قەرەبوو بکاتەوە .

**شەشەم : باوەڕ بە قەدەر**

ئەمەش بنەمای شەشەمە لە بنەماکانی ئیمان و باوەڕ، کە مەبەست لێی ئەوەیە کە خوای گەورە زانایە بەوەی بووە، و بەوەشی دەبێت، وە زانایە بە حاڵ و ئەحواڵ و ڕزق و ڕۆزی و ئەجەل و کاروکردەوەی بەندەکانی، وەهیچ شتێك نییە لای ئەو شاراوە بێت، وە باوەڕ بەوەی خوای گەورە تەقدیر و ئەندازەگیری هەموو دروستکراوەکانی خۆی نووسیوە، وەهیچ شتێك بەبێ عیلم وئاگاداری ونووسین و ویستی ئەو ڕوو نادات .

**باوەڕ بە قەدەر چەند شتێک دەخوازێت** ([40]) :

**یەک** : باوەڕ بەوەی خوای گەورە زانایایە بەوورد و درشتی هەموو شتێك، زانیویەتی چی بووە، وە چیش دەبێت، وە دیسان زانایە بەوەی کە نەبووە، وە بە چۆنیەتی ئەوەشی ئەگەر بهاتایە ببوایە .

**دوو** : باوەڕ بەوەی کە هەموو ئەو شتانەی وتمان خوای گەورە لە ( لوح المحفوظ ) دا نووسیونی .

خوای گەورە لەم بارەیەوە فەرموویەتی : ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ إِنَّ ذَٰلِكَ فِي كِتَابٍ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٧٠﴾﴾ ([41]) واتا : مەگەر تۆ نەتزانیوە ئەی مرۆڤی ژیر! کە

([40]) شرح أصول الإيمان، للشيخ محمد بن صالح العثيمين.

([41]) سورة الحج : الآية 70.

هەرچی لەئاسمان و زەوییدایە کەخوا ئاگای لێیەتی و دەیزانێ ؟ چونکە بە ڕاستی هەموو ئەو شتانە لە پەڕوای (لوح المحفوظ) دا تۆمار کراوەو هیچی لێ زایە نابێت, بێگومان ئەوکارەش بۆ خوا زۆر ئاسانە .

ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی کردووە، کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : { كَتَبَ اللَّهُ مَقَادِيرَ الْخَلَائِقِ قَبْلَ أَنْ يَخْلُقَ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ بِخَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ } ([42]) واتا : خوای گەورە پێش پەنجا هەزار ساڵ لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی تەقدیر و ئەندازگیری سەرجەم دروستکراوەکانی نووسیووە .

**سێ** : باوەڕ بەوەی کە سەرجەم ئەو شتانەی ڕوو دەدەن، ڕوو نادەن بەوویست و مەشیئەتی خوای گەورە نەبێت، جا چی ئەو شتانە پەیوەندیان بە کار وکردەوەی ذاتی هەق تەعالای خۆیەوە هەبێت، یان پەیوەندیان بە کار وکردەوەی بەندەکانەوە هەبێت، خوای گەورەش فەرموویەتی : ﴿وَرَبُّكَ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ وَيَخْتَارُ﴾ ([43]) واتا : هەر پەروەردگاری تۆیە هەر چیەکی بوێت دروستی دەکات و هەڵی دەبژێرێت, هەروەها فەرموویەتی :﴿هُوَ ٱلَّذِى يُصَوِّرُكُمْ فِى ٱلْأَرْحَامِ كَيْفَ يَشَآءُ﴾ ([44]) واتا : ئەو خوایە ذاتێکە چۆنی بیەوێت نەخشەی ڕووخسارتان لە منداڵدانەکاندا دەکێشێت، هیچ پەرستراوێکی بەهەق و ڕاست نییە جگە لەو خوایە, ئەو ذاتە باڵادەست و دانا و کاربەجێیە .

---

([42]) رواه مسلم في كتاب القدر ، باب حجاج آدم وموسى عليهما السلام (2653).
([43]) سورة القصص : الآية 68.
([44]) سورة آل عمران : الآية 6.

**چوار :** باوەڕ بەوەی، ئەوەی هەیە لەگەردووندا هەر هەمووی دروستکراو و مەخلوقی خودایە ﷻ، وە هەرچی گەردیلەیەك لەئاسمانەکان و زەویدا هەیە، خوای گەورە بەدیهێنەریەتی، وە بەدیهێنەری جوڵە و سەکەناتیەتی، هیچ بەدیهێنەر و دروستکەرێك نییە جگە لە ئەو، هیچ پەروەردگار وهەڵسوڕێنەرێك نییە لەم دونیایەدا جگە لە ئەو، لەم بارەیەشەوە فەرموویەتی : ﴿ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ وَكِيلٞ ﴾ [45] واتا : خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکە وە هەر ئەویش پارێزەری هەموو شتێکە، هەروەها فەرموویەتی : ﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمۡ وَمَا تَعۡمَلُونَ ﴾ [46] واتا : هەم خۆتان و هەم ئەو بتانەی دروستیان دەکەن لە دارو بەرد، خوا بەدیهێناون، واتا : ئەو خوایە دەسەڵاتدارێکی وەهایە، ئەگەر بیەوێ ناهێڵێ ئێوە هیچ شتێ بکەن و، هێزو تواناتان لێدەسێنێتەوە .

### بەرهەم وشوێنەواری باوەڕ بە قەدەر :

1 ) پشت بەستن بەخوا بە ( ذاتی الله )، لەگەڵ گرتنە بەری ئەو هۆکارانەی خوای گەورە ڕێگای پێداوون، بەشێوەیەك نابێت بەندەکان پشت بەو هۆکارانەوە ببەستن کە دەیگرنە بەر، بەڵکو تەنها پشت بەخوای گەورە ببەستن، چونکە هەموو شتێك بەقەدەری خوا ڕوو دەدات .

---

(45) سورة الزمر : الآية 62

(46) سورة الصافات : الآية 96.

2) بەندەکان ئەوە بەلایانەوە جێگای سەر سوڕمان نییە لەو ئاوات وخۆزگانەی کە دێتە دی بۆیان. چونکە هاتنەدی ودەستکەوتنیان نیعمەتێکی خوای گەورەیە بۆ بەندەکانی، ئەویش بەوەی قەدەری کردووە، لەهۆکاری خێر و سەرکەوتن .

3) دڵ ئارامی و ئاسوودە بوونی دەروونی لە بەرامبەر ئەوەی ڕوو دەدات لەقەدەری خوای گەورە، بەندەی ڕاستەقینەی خوا هیچ تووشی دڵەڕاوکێ وخەم وخەفەت نابێت لەو شتانەی لەدەستی چوون، یان لەو ناخۆشی وناڕەحەتیانەی تووشیان دەبێت، چونکە هەموو شتێك بە قەدەری خوای گەورە ڕوو دەدات .

## گرنگی بیروباوەڕ

**گرنگیدان بە بیروباوەڕ** : لەئەنجامی ئەوەی پێشتر باسمانکرد بۆمان ڕوون بوویەوە پایەی هەرە گرنگ کە ئەم ئیسلامەی لەسەر بنیات نرا بێت بریتیە لە بیروباوەڕ، چونکە مرۆڤ بەبێ بیروباوەڕێکی ڕاست و دروست، لەم دونیا پان و پۆڕەدا وێڵ وسەرگەردانی ناو شیرك و شەهواتەکانی دەبێت، بێگومان بیرباوەڕی ڕاست ودروست جوڵێنەری سەرەکی ژیانی مرۆڤە، مرۆڤ بەبێ بیرباوەڕ وەك ئاژەڵی لێدێت، و بگرە کەمتر لەئاژەڵیش، وەك خوای گەورە فەرموویەتی :﴿أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ ۚ إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَامِ ۖ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٤٤﴾﴾[47] واتا : ئایا وا دەزانیت زۆربەی ئەوانە ڕاستیەکان دەبیستن، یان بیرو هۆشیان دەخەنە کار؟ خۆ ئەوانە هەر وەك ماڵاتن (بزن، مەڕ، وشتر، گا) خاوەنی بیرکردنەوە نین، بەڵکو لەوانەشە گێل و وێڵ تر و نەزانتربن، چونکە گەلێك جار ئاژەڵ بەگوێی خاوەنەکەی ئەکات، هەرکەسێکیش چاکەی لەگەڵ بکات لەبیری ناچێت .

جا ئەگەر بیروباوەڕ هێندە گرنگ بێت لەژیانی مرۆڤدا، وهێندە پێویست بێت بۆ ژیانی، پێویست تر لە نان و ئاو، دەی کەواتە دەبێت ئێمەیش گرنگیەکی زۆری پێ بدەین بۆ ئەوەی ئاسوودە بین لەژیانی دونیا و دواڕۆژدا .

---

(47) سورة الفرقان : الآية 44.

## ئامانجەکانی بیروباوەڕی ئیسلامی

1) پاك كردنەوەی نیەت وئیخلاص و دڵسۆزی و پەرستن بۆ خوای گەورە (الله) ﷻ، چونكە خالیق و بەدیهێنەرمان هیچ شەریك وهاوەڵێكی نییە، لەبەرامبەردا پێویستە نیەت ومەبەست وتەواوی پەرستنەكان هەر بۆ ئەو ذاتە بێت .

2) ئازاد كردنی بیر وژیری و عەقڵی مرۆڤ لەو نارێكی و بێ سەروبەریانەی كە لەئەنجامی بەتاڵی دڵەكان لەبیروباوەڕ دروست دەبن، چونكە هەر كەسێك خاوەنی بیروباوەڕێكی ڕاست و دروست نەبێت ، یان دڵی خاڵیە لەهەموو بیروباوەڕێك، ئەو كاتە دەبێتە بەندە وگوێ لەمستی هەواو وئارەزووەكانی، یان لەناو گومڕایی وسەرگەردانی بیروباوەڕی پڕ لەخورافیاتدا دەتلێتەوە .

3) فەرامهێنانی ئاسوودەی دڵ و دەروون و بیر و فیكر، ئەوەی خاوەنی بیروباوەڕێكی ڕاست و دروست بێت ڕزگاری دەبێت لە دڵەڕاوكێ و نا ئارامی بیروهۆشی، چونكە ئەم بیروباوەڕە ڕاست و دروستەی ئیسلام مرۆڤ پەیوەست دەكات بە خوای گەورە و خالیق و بەدیهێنەریەوە .

4) سەلامەت بوونی نیەت و كار و كردەوەكانمان لە لادان وئینحراف بوونی ئەو عیبادەت و پەرستنانەی بۆ خوای گەورە دەكەین، چونكە پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێت) ئەم بیروباوەڕەیان ڕوونكردوەتەوە، دەی شوێنكەوتنی پێغەمبەرانیش پایەیەكی گرنگی ئاینە، هەركەسیش سەرگەردان و گومڕا بوو لە شوێنكەوتنی پێغەمبەران ئەوە بێگومان تووشی لادان و ئینحراف دەبێت لە شوێنكەوتنی بیروباوەڕی ئیسلامدا .

5) بیروباوەڕی ڕاست وردوست مرۆڤ فێری ڕاوەستاوی و جدیەت دەكات لەكاروباریدا، بەشێوەیەك بەندەی ڕاستەقینەی پەروەردگار هیچ هەلێكێ خێر لەدەست خۆی نادات، بەڵكو بەهەموو شێوەیەك هەوڵ دەدات بگات پێی و بەشدار بێت تێیدا، لەهەمان كاتدا هەركاتێك گوناهو تاوانی لەهەر شوێنێك هەست پێ كرد خۆی لێ بەدوور دەگرێت و نزیكی نابێتەوە .

6) بیروباوەڕی ڕاست و دروست ئوممەتێكی بەهێز دروست دەكات، ئوممەتێك ئامادەیە لەپێناو ڕەزامەندی خوای گەورە و جێگیركردنی دینەكەیدا هەموو شتە گران بەهاكانی ببەخشێت، گوێ بەو نارەحەتی و ناخۆشیانە نادات كە لەپێناو خوای گەورەدا تووشی دەبێت .

7) گەیشتن بە خۆشبەختی و بەختەوەری دونیا و دواڕۆژ، ئەویش بە چاكسازی وئیصلاح كردنی تاك و كۆمەڵگەكان لەسەر بیروباوەڕێكی ڕاست و دروست، وگەیشتن بە ڕەزامەندی خوای گەورە و پاداشتی هەتا هەتایی و نەبڕاوەی بەهەشت .

لەخوای گەورە دەپاڕێینەوە، هەموو ئەم ئامانجانە بۆ ئێمە و تەواوی موسڵمانان لەسەر ڕووی زەوی جێبەجێ بكات ( اللهم آمین یارب العالمین ).

## (الولاء والبراء )

## پشتیوانی کردن و پشت لێهەڵکردن

گرنگی ئەم بابەتە لە بیروباوەڕی موسڵماندا :

یەکێك لە پایە و بنەماکانی بیروباوەڕی ئیسلامی، ئەوەیە پێویستە لەسەر هەموو موسڵمانێك کە هەڵگری بیروباوەڕێکی ڕاست ودروستی ئیسلامی بێت، پشتیوان و پاڵپشتی ئەهلی ئیسلام بێت، و پشتیش هەڵبکات لەوانەی دوژمانەیەتی دەکەن، یەکخواپەرستان و ئەهلی تەوحید ودڵسۆزانی ئەم دینەی خۆش بوویێت وپشتگیریان بکات، لەهەمان کاتیشدا بێباوەڕان و هاوەڵ بڕیاردەرانی خۆش نەویێت و ڕقی لێیان ببێتەوە ودژمنایەتیان بکات، ئا ئەمەش ئەو میللەت وئومەتەیە کە خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا مەدح و ثەنای کردووە و ناوی لێ ناوە( میللەتی ئیبراهیم ) وداوای لێکردووین شوێنی بکەوین، وەك فەرموویەتی : ﴿ قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَدًا حَتَّى تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ ﴾ [48] واتا : ئەی ئیمانداران، بەڕاستی لە ئیبراهیم و ئەوانەی کە لەگەڵیدا بوون نموونەیەکی چاکتان خراوەتە بەرچاو بۆ ئەوەی شوێنیان بکەون، کاتێك کە بە قەومەکەی خۆیانیان وت : دوای ساڵەها بانگەواز، ئێمە بەرین لە ئێوە و لەو

(48) سورة الممتحنة : الآية 4.

شتانەش کە لەجیاتی خوا دەیپەرستن، ئێمە باوەڕمان بەو دین و ئاینەی ئێوە نیە، ئیتر دوژمنایەتی و ڕقەبەرایەتی لەنێوانماندا بەرپا بووە تا ئەو کاتەی کە باوەڕ بە خوای تاك و تەنها دەهێنن.

هەروەها بە باوەڕدارانیشی فەرمووە، ئەو باوەڕدارانەی شوێن محمد المصطفى ﷺ کەوتون :

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوۡلِيَآءَۘ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَإِنَّهُۥ مِنۡهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٥١ ﴾ [49] واتا : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! جولەکە و گاورەکان مەکەنە دۆست و پشتیوانی خۆتان، واتا : نە یارمەتیان بدەن و، نەداوای یارمەتیشیان لێبکەن، وە بەهیچ جۆرێك (موالات) و هاوکاریی و خۆشەویستیان نەبێت بۆیان , چونکە ئەوانە هەندێکیان پشتیوان و یارمەتیدەری هەندێکیانن، و لەبەر ئێوەش دەست لەدینی خۆیان هەڵناگرن، و گشتیشیان بۆ ئێوە دەبنە یەك دەستەو بەستەو، لەرۆژی خۆیدا گەلەکۆمەتان لێدەکەن , و هەرکەسێکیشتان دۆستایەتییان لەگەڵ بکات و، بیانکات بەیارمەتیدەرو دۆستی خۆی، وە یان هاوکارییان بکات , بێ شك ئەوکەسە هەر لەوانەو بەوان دادەنرێت , بێگومان خوا هیدایەت و ڕێنومایی گەلی ناهەق و ستەمکار ناکات .

(الولاء والبراء ) پشتیوانی کردنی باوەڕداران، و پشت لێهەڵکردن لە بێباوەڕان، پایەیەکی گەورەی بنەماکانی دینە، بەڵام بەداخەوە زۆرێك لەخەڵکی بێ ئاگا و نەشارەزان لێی، چەند جار گوێمان لە کەسانێك بووە کە خۆیان بە موسڵمان دەزانن ، کەچی بانگەواز و بانگەشە بۆ

(49) سورة المائدة : الآية 51.

یەککگرتنی ئاینەکان دەکەن، دەڵێن گاورەکان برامانن، نەك هەر ئەوەندە بەڵکو هەندێکیان دەڵێن جولەکەیش برامانن، بەڕاستی زۆر جێگای مەترسییە خاوەنی ئەم ووتانە بەو هەڵوێستانەی پاشگەز بێتەوە لەدین، چونکە ئەو دینەی کە لای خوای گەورە وەردەگیرێت و مایەی سەرفرازی دونیا و دوارۆژە تەنها ئیسلامە، وەك خوای گەورە خۆی فەرموویەتی : ﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُ ﴾ (50) واتا : بێگومان تەنها ئەم دینی ئیسلامەیە, پەسەند و قبووڵە لای خوا, چونکە پالاوتەو پوختەی تەواوی ئایینە ئاسمانییەکانی ترە .

لەجێگایەکی تردا دەفەرمووێت: ﴿ وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٨٥ ﴾ (51) واتا : هەرکەسێك بێجگە لەبەرنامە و شەریعەتی ئیسلام هەر دینێك بۆخۆی هەڵبژێرێت و بیکات بەبەرنامەی خۆی، هەرگیز لێی وەرناگیردرێت, و لەدوارۆژیشدا لەڕیزی زیانمەندانە .

خوای گەورە پشتیوان و پشتیگری بێباوەڕانی لەسەر باوەڕداران حەرام و یاساغ کردووە، ئەگەر چی نزیکترین کەسیش بن لێوەیان، وەك فەرموویەتی :﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُوٓاْ ءَابَآءَكُمۡ وَإِخۡوَٰنَكُمۡ أَوۡلِيَآءَ إِنِ ٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡكُفۡرَ عَلَى ٱلۡإِيمَٰنِۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ٢٣ ﴾ (52) واتا : ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، ئەگەر باو و باپیران و براکانتان کوفریان لا

---

(50) سورة آل عمران : الآية 19.

(51)سورة آل عمران : الآية 85 .

(52) سورة التوبة : الآية 23.

باشترو چاکتربوو لەئیمان و باوەڕ، مەیانکەنە دۆست و خۆشەویستی خۆتان و پەیوەندیتان لەگەڵیاندا نەبێت , هەرکەسێکتان ئەوانەی خۆشبوێت و بیانکاتە دۆستی خۆی, دیارە ئەو جۆرە کەسانە ستەمکارن.

ئیبن عەباس رضي الله عنه لەتەفسیری ئەم ئایەتەدا ئەڵێت : دەبنە موشریك و هاوبەشدانەر بۆ خوا، بەڵێ: حوکمی ئەم ئایەتە تا ڕۆژی قیامەت بەردەوامەو، دەبێت تەواوی موسڵمانان تەنها و تەنها خوا خۆشەویستی و (موالات)یان بۆ خوا هەبێت و، هەر لەگەڵ ئەهلی خوادا بن .

هەروەك چۆن خوای گەورە حەرامی کردووە دۆستایەتی وخۆشەویستی بۆ دوژمنانی بیروباوەڕی ئیسلامی هەبێت، چونکە خوای گەورە خۆشەویستی ودۆستایەتی بۆ باوەڕداران واجب کردوە، وەك فەرموویەتی : ﴿إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ اللَّهُ وَرَسُولُهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا الَّذِينَ يُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَاةَ وَهُمْ رَاكِعُونَ ۝ وَمَن يَتَوَلَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالَّذِينَ آمَنُوا فَإِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْغَالِبُونَ ۝﴾[53] واتا : بەڕاستی تەنها خۆشەویست و پشتیوانی ئێوە، هەر خواو پێغەمبەرەکەی و ئەوانەن باوەڕیان هێناوە، ئەوانەی کە نوێژەکانیان بەچاکی ئەنجام دەدەن و زەکات لە ماڵ و سامانیان دەردەکەن و هەمیشە دیاردەی کڕنوش و ملکەچییان بۆ پەروەردگار پێوە دیارە ﴿٥٥﴾ هەرکەسێکیش دۆستایەتی لەگەڵ خواو پەیامبەری خواو ئەوانەدا بکات کە بڕوایان هێناوە، ئەوا دەبنە حیزب و گرووپی خوا , بێگومانیش تەنیاو تەنیا حیزب و کۆمەڵی خوا سەرفرازو زاڵ و سەرکەوتوون.

---

(53) سورة المائدة : الآيتان 55-56.

## شێوەکانی پشتیوانی و پشتگیری بێباوەڕان :

1) خۆچواندن ولاسایی کردنەوە لە جلوبەرگ وپۆشاك لەبەرکردن و قسەکردن، حەرامە ئێمەی باوەڕدار خۆمان بچوێنین ولاسایی ئەوان بکەینەوە لەو شتانەی کە لە تایبەتمەندیەکانی پەرستن و داب و نەریتی ئەوانن، وەك ڕیش تاشین، وسمێڵ درێژکردن، و لاسایی کردنەوەیان لە ڕواڵەت وجلوبەرگ و خواردن و خواردنەوە، هەروەها قسەکردنیش بەزمانی ئەوان لەکاتی پێویستیدا نەبێت .

2) مانەوە لەووڵاتی بێباوەڕان و کۆچ نەکردن بۆ ووڵاتی موسڵمانان، لەبەر ڕەزامەندی پاراستنی دینکەت .

3) گەشت کردن بۆ ووڵاتانی بێباوەڕ بە مەبەستی سەفا و سەیران وخۆشی وشادی .

4) یارمەتیدان وکۆمەکی کردنیان لەدژی باوەڕداران .

5) داوای یارمەتی لێ کردن ومتمانە پێ بوونیان، یان دەست نیشان کردن ودانانیان لەو جێگایانەی کە نهێنی موسڵمانانی تێدایە، یاخود نزیك کردنەوە و پرس وڕاوێژ پێکردنیان لەکاروبارەکانی تایبەت بە موسڵماناندا .

6) حساب کردن بە ڕۆژمێری ئەوان، بەتایبەتی لەو مێژوانەی کە تایبەتە بە جەژن و یادەکانی ئەوان، وەك جەژنی سەری ساڵی زاینی .

7) بەشداری کردن لە ئاهەنگ و جەژنەکانیاندا، یان یارمەتی دانیان لە سازکردنیدا، یان پیرۆزبایی لێ کردنیان بە بۆنەی جەژنەکانیانەوە، یان ئامادەبوون لەگەڵیاندا .

8) ناونان بە ناوی بێباوەڕانەوە، و پشتهەڵکردن لە ناونانی منداڵەکانمان بە ناوی موسڵمانانەوە.

9) داوای لێخۆش بوون بۆ کردن، وڕەحمەت بۆ ناردنیان، چونکە کارێکی لەو شێوەیە ئەوە دەگەیەنێت تۆ ئەوانت خۆش دەوێت و بەڕاستیان دەزانیت ([54]) .

([54]) محاضرات في العقيدة، للشيخ صالح الفوزان : (231/1).

# پێڕستی بابەتەکان